شـيعر

# هەناسەکەم

دلێر محەمەد

بەرگی دووەم

2006






- ناوی کتێب : هەناسەکەم
- ناوی نوسەر: دلێر محەمەد
- بابـــەت : شـــــــيعر
- سەرپەرشتی چاپ: ناسك سعيد
- تایپ و نەخشەساز : سۆزان محەمەد
- تیراژ: 750
- ژمارەی سپاردن:

لە زنجیرە بلاّوکراوەکانی سەنتەری رۆشنبیریی شار
زنجیرە ( 3 )

# پێشەکی

فرمێسکی چاوی شیعری من بۆ سەفە ری یارەکەمە
ئەو کەسەی من خۆشم ئەویٰ خۆری گەشی شارەکەمە
ئێستەش ئەروا و بارگەی کۆچی عەشقی منی لە کۆڵ ناوە
هەروەك ئەوەی نەی ناسیبم دڵمی لە خاچی خەم داوە
دڵم پڕە لە ئەشکی خەم رۆحم کێڵگەی عەشق و ژانە
خۆشەویستی لەم وڵاتەدا وەرزێکە پڕ لە خەزانە

لە پە نجەرەی ئەوینەوە نیگایەکی پڕ لە ئەسرین وێڵە بە دو سەرابێکە...عاشقیٰ دەفتەرەکەی پڕە لە یادگاری و خۆشەویستی، حەرفەکانی شاعیر لە تەنیایدا لە ئەستێرەی شەوەکانی عەشق ئەچیٰ . دلێر محەمەد بە هەستێکی قوڵەوە لە دواندنی روحی خۆیا دەروێشانە سۆز ئەکا. ئەم شیعرانە، ئەم حەرفانە هەموو چە پکە گوڵ و یادگاری عەسقی جارانە. شیعرێك پێناسەی یەکەم چرپەی خۆشەویستی دوایین نامەی سەفەر ئەکا. ئەشیٰ دۆزینەوەی رۆحسٚکی





نامۆ لە چاوی شیعرێکدا بەلاٌم هەرگیز ناشیٰ مردن لە حەرفێکی شیعرەکانی دلێر محەمەدا.

شەهاب زەنگەنە

## وتەی شاعیر

خوێنەری خۆشەویست شادمان ئەبم ئەگەر لەم بەرگەدا توانیبێتم کەمێك لە راستییەکانی لاوانی عاشق لەم شارەدا لە شێوازی هۆنراوە دارێژم دڵنیام زۆربەی زۆری لاوان هەناسەکانیان بۆنی دووری و دابرانی لێدیٰ منیش بڕوام بەو راستییە هەیە کە خۆشەویستی ئەگەر چی کەم عومر بیٰ یادگاریەکانی زۆر تەمەن درێژن.

لێرەوە حەز ئەکەم پڕ بە دڵ دەست خۆشکەری لە ستافی( سەنتەری رۆشنبیریی شار) بکەم کە ئەرکی لە چاپدانی ئەم بەرهە شیعریەی گرتۆتە ئەستۆ لەسەر ئەرکی ئەوان لە چاپدرا بەتایبەتی کاك سۆران و خاتوو ناسك و کاك هێمن و کاك دانا و تەواوی ئەندام بەشەکان چونکە زۆر ماندوبون بۆیە بەرهەم هێنانی ئەم بەرهەمە هیوای تەمەن درێژیان بۆ ئەخوازم و ئاواتە خوازم وەك پیشەی هەمیشەیی خۆیان یاریدەدەر و هاوکاری تێکرای نوسەرو شاعیرو هونەرمەندان بن .....لەگەڵ رێزدا.

دلێر محەمەد

# بەشی یەکەم

# خۆشەویستی و ئازارەکانی دابڕان





## وەسیەت ئەکەم

بەرلەوەی کە بەجێم بێڵی بتوتایە ئیتر تەواو
عاشقت ئەهێنمە کۆتایی سیمات ون ئەکەم لەبەرچاو
خۆمن لێت زویر نەئەبوم گیانە هەر خۆشم ئەویستی
عاشق لەیەك بێزار نابێ ئەگەر پاك بێ بیروهەستی
بەلاَم سەد کەرەت مەخابن لەگەڵ ئاسۆی ئێوارانا
دابرانوەك هەورێکی رەش باڵی کێشا بەسەرمانا
نازانم تۆ چۆن دڵت هات بمخەیتە شاری تەنیایی
بێ لە تۆ لەکەس تێناگەم بۆ رۆشتی بێ ماڵئاوایی
هەموو شەوێ خەو ئەبینم بەلای مندا تێئە پەرئەکەی
بەرەو دەرگاکەم رائەکەم وا ئەزانم بانگم ئەکەی
کاتێ کە چاوم هەڵئەبرم ئەوجا ئەزانم خەیاڵە

تۆ بە جۆرێ بە جێتهێشتم یەکگرتنەوەمان مەحاڵە
هەرچەندە بێنازتکردم ئەمەیە دوا وتەی ژینم
لە پێش ئەوەدا کە بمرم وەسیەت ئەکەم تۆ ببینم.

## سەرینی خەم

هەمو شەوێ سەری کاسم ئەنێمە سەرسەرینی خەم
بە چاوی پڕ لە گریان و وەنەوزێکی زۆر ئێجگار کەم
خۆ نیوەروان جگە لە تۆ هیچ شتێکم لە بیر نییە
عەسرانیش سەیران و خۆشی من نازانم تامی چییە
بە یانیانیش لە خورێنی تێر ئەبم لە خەمەکانم
وشەیەکم بۆ نانوسرێ تەواو بێ هۆنراوەکانم
نەچاو، نەدەست، نەقەڵەمم هیچ وشەیەکی بۆ نایە
چونکە ئیلهامی ئەم شیعرەم لەگەڵ هەنگاوی تۆدایە
هەناسەکەم دەدەرکەوە چاوەڕێم بێی بە میوانی
دڵنیام ئەو کاتەی کە دێی شیعر ئەبێ بە گۆرانی.





## بگەڕێوە

جێم مەهێڵە عەزیزەکەم بۆ کوێ هەوارگەت لێکناوە
کۆڵی دابڕان ستەمە بۆ لە کۆڵت گرێداوە
هەراسان بێ دەرەتانم غەمەکان چاوەڕێم ئەکەن
دوای کۆچت نەهامەتیەکان ڕێم پێدەگرن زوپێم ئەگەن
خۆ کە ئەرۆی جگە لەوەی تەنیام ئەکەی بەبێ هاودەم
ناچارم چە پۆکی غوربەت بە روخساری دڵما بدەم
لەدوای تۆ چاوەکانی من ئەبن بە فرمێسك و گریان
شەوان بەدەم هەنسکەوە بۆت ئەنوسم هۆنراوەکان
جێم مەهێڵە شیرینەکەم گەروم پڕ قوڵپی گریانە
مەبەستی تۆ دابڕان بێ جێگەی منیش گۆڕستانە
دەگیانەکەم لە پێش ئەوەی بمرم و بۆگۆڕ ببرێم

بگەرێرەوە بۆلای من با تێر دەستم لە دەستت نێم.

## گڕی عەشق

هەتا دوربی گڕی عەشقت زیاتر بلێسەی بەتینە
برۆیتە شارێکی تریش شێوەت وەك جاران شیرینە
گەر بیانەوێ ناوەکەت لەناو خوێنما دەربهێنن
تەنیایەك رێگایان هەیە کۆتایی بە ژیینم بێنن
با ئەزمەر و پیرەمەگرون بکەن بە بەربەستی دڵم
هەتا ئەبەد خۆشم ئەوێی قەت لە بیرم ناچی گوڵم.





## شیرینەکەم

کاتێ کە بیستت من مردم
مەرێژە فرمێسکی چاوت
ئازاری مەدە سنگی خۆت
مەژاکێنە زوڵفی خاوت
ئیتر گریان بێفایدەیە
دوای مەرگ شیوەنم ناوێ
ئەی بۆ کاتێ داوام ئەکرد
پێت ئەبەخشیم سۆمای چاوێ
خوات لەگەڵبێ شیرینەکەم

بۆ دوا جارماڵئاوابێ
عەشقەكەت ئەبەم لەگەڵ خۆم
با بۆ گۆریش لەگەڵمابێ.

## من وەك تۆ نییم

بروام نەبوو وشەكانت بكەی بە تیرێ بۆ چاوم
قەت لەو خەیاڵەدا نەبوم لەناو دڵت دەركەی ناوم
بەخەیاڵی كیێدا ئەهات پڕیكەی لەخەم ئەم دڵە
چەندە سەیرە خۆشەویستیت بەهاریێكە بەبێ گوڵە
چاوەرێ بوم بۆ بەهارێ گوڵی دەستی تۆم بۆبێنێ
دڵی شێتم وایئەزانی گوڵی شادی بۆ ئەهێنێ
گیانە من وەكو تۆ نابم وشەی عەشق لە دڵمایە
ئەڵێم هەرچی بێوەفایە نابینابێ لەم دنیایە
ئەوەی كە بۆم ماوەتەوە غەمە دەفتەرە پێنوسێ





لە شیعرا ناوی تۆ نەبەم پێنوسەكەش هیچ نانوسێ.

## بێباكم

ئەگەر بەوە ئاسودەبی دڵی خۆمت بۆ دەربێنم
ئامادەم دڵت ناشكێنم كۆتایی بە ژینم دێنم
گەر ویستت چاوم نەبینێ جارێك پێم بڵێی و لێمگەرێ
شەرتە هەتا كاتی مەرگ لاشەم بە كوێری بگەرێ
گەر هۆنراوەم شادت ئەكا لە ئێستاوە بەڵێن ئەدەم
هەر هۆنراوەیەك بنوسم بە ناوی تۆ دەستپێئەكەم
گەر حەزئەكەی ئاسودەبم نەڵێن تۆ عەشقەكەت وێڵە
من یەك تكا لە تۆ ئەكەم تەنیا ئەڵێم جێم مەهێڵە.

## دوای دڵ

با گشت پیتی شیعرەکانم
ریز ببەستن بن بە دێڕ
تا هۆنراوەیەك دروستکەن
زۆر بە نرختر بن لە زێڕ
چی وشەی جوانی سینەمە
هەموی بۆ تۆ بە کاردێنم
ئیتر هاودەمی عەشقی تۆم
هیچ کەسی تر نادوێنم
هۆنراوەم لە جێی دەستانم





لە دەرگای دڵی تۆ ئەدات
سەیری هەر پیتێکی بکەی
داوای عەشق لە تۆ ئەکات.

## یەکەم سەرنج

یەکەم نیگاو سەرنجی‌تۆ سەرسامی کردم بە جارێ
لەو رۆژەوەی کە تۆم دیوە ئاوا تمە تەنیا دیدارێ
هەرجارێ کە تێپەر ئەبێ وا پەیوەست بوی بە ژینمەوەی
جارێ تەواو تێنا پەرێ چاوەرێم کە بتبینمەوە
ئاخۆ بلێیی رۆژێ دابێ لە هەستی دڵم تێبگەی
ئەو عەشقەی لە سینەمایە بۆت باس بکەم رێم پێبدەی
خۆزگە ئەتزانی عەشقی تۆ لەناو خوێنما چۆن ئەگەرێ
رەنگە خۆت پێت بوتمایە نامەکەی گیرفانتم بەرێ
ئەگەر دڵ شکاوم نەکەی لێوم دوا وتەت بۆ ئەدوێ

وا  پێنوسەکەم کاڵبۆوە هێندە نوسی خۆشم ئەوێ.

## دڵنیام

کە شەو دادێ تارمایی غەم ناهێڵێ ساتێ بسرەوم
ئەگەرێ بەدوای نامۆدا دیارە ئەزانێ من ئەوم
کە شەو دادێ دەروازەی خەم بەسەرمندا ئەکرێتەوە
ئیتر پەنا بۆ کوێ بەرم ئاخۆ کەی شادی بێتەوە
ئاخۆ کەی بێ، بێیتەوە لام ببینی سیمای ژاکاوم
دڵنیام هەتا دێیتەوە مردوم دەمێکە نەماوم.





## بەهار بە من چی

چی لەبەهار و نەورۆزکەم کە بێهیوام لە ژیانم
دنیا بڵێسەی جوانی بێ من وام لەلای خەمەکانم
جلی شاڵ لەگەڵ فەرەنجی چۆن بتوانم لەبەریکەم
لە کاتێکا منی تەنیا دڵم پڕبێ لە دەردو خەم
چراخانی شاخی ئەزمەر بەمن چی کە دابڕاوم
کە پری دوکان و قەشقۆڵی خۆشیم پێنادەن تاماوم
چۆن بەهارم بەسەر بەرم کە دوری یار لە دڵما بێ
یاریش بێئاگا لە دڵم لەگەڵ کەسێکی تردابێ
نەکو نەماسی نەقەراخ جادەی سالم و سەرچنار
لێوی منیان بۆ ناجوڵێ خۆشیم بەدیناکەن یەکجار

کەوابێ چی لە بەهارکەم چوار وەرزی ساڵم خەزانە
بادانیشم بۆ دەردی خۆم من بەشم هەر دابرانە.

## کۆرپەی هیوا

هەر لەیەکەم بینینەوە تـا مەزرۆم بوم دیدارت
نەم ئەتوانی شەرمم ئەکرد سەرنج بدەم لە روخسارت
رەنگە بڵێم ساڵێك ئەبێ عەشقت هاتۆتە خوێنمەوە
دڵی خۆمت پێشکەش ئەکەم نەشتەوێ هەر بۆت دێنمەوە
تۆبوی بە چرای شەوی من پڕ هیوات کرد خەونەکانم
بە دەستی تۆ چرۆ ئەکا نێژراوی ناو باخەکانم
دەبا ئیتر کۆرپەی هیوا لە باوەشی عەشقا بنوێت
چونکە خۆم پێڕاناگیرێ دڵ پێم ئەڵێ خۆشم ئەوێت.





## هەناسەکەم

بریار ئەدەم خۆشەویستیت ئەخەمە سەروچاوانم
رۆژگاری رەش بەرێئەکەم وەلای ئەنێم خەمەکانم
خۆشەویستییەك تا ئێستا بۆ هیچ کەسم دەرنەبریوە
نە هاورێیەتی نە عەشق بە منیانەوە نەدیوە
سەرەتا بو وامئەزانی تەنیا خۆشەویستی نییە
بروام نەبو والە ناکاو دڵم پربێ لەم شادیە
سوپاس بۆ خوا لە پێش ئەوەی بە تەنیا بمبەن بۆ سەیوان
کەسێکی وەکو تۆم ناسی دڵنیای کردم لە ژیان
لە ئێستاوە بە ڵێن ئەدەم تا دواهەناسەی مردنم

خۆشەویستی و عەشق و سۆزت مەرگ داینیٚ لە گەردنم
دوای مردنیش ئەگەر هاتی تۆ بۆ سەردانی گۆڕەکەم
ڕەنگە گوێت لێبیٚ کە ئەڵێم دەك بە خێربێی هەناسەکەم.

## ئەلبوم

ئەزانی لە دوای کۆچەکەت پێکەنینەکەشت بردم
هەستی بینینم لاوازە بۆ شاری خەم بەرێتکردم
عەزیزەکەم سەفەرەکەت کردە کۆتیٚ بۆ گەردنم
زۆر ئەترسم نەتبینمەوە هەتاکو پرسەی مردنم
کەی دێیتەوە لەگەڵ خۆتا پێکەنینم بۆ ئەهێنی
لەگەڵ جانتای سەفەرەکەت چاوی شادیم پێهەڵدێنی
ئەمەویٚ سەیری وێنەتکەم وێنەکەت جواب ناداتەوە
ئەلبومەکەشم لێزیزە تورەیە خۆی ناکاتەوە
مەبەستمە ئاشتی کەمەوە ئەڵیٚ لە ئێوە بە داخم





ئەڵیٚ کوا وێنەی ئاهەنگتان بێم بگاو بیکەمە ناخم
دە گیانەکەم با پێکەوە بڕۆینە لای وێنەگریٚ
تەمەن تا سەر بۆ کەس نییە نەك مەرگ ئێخەمان بگریٚ.

## بیرم ناچیٚ

لەگەڵ هەر لێدانێکی دڵ
شێوەکەتم بیردێتەوە
دەك ئەجەل بێتە میوانم
وەفای تۆم لە بیر بچێتەوە
نەهامەتی بێتە ڕێگەم
گەربێت و تۆم لە بیربچیٚ
عەشقت ریشەی داکوتاوە
بەناخی دڵما ڕۆئەچیٚ
ڕۆژەگارەکانم جوان ئەکەی

شادیت کردە ژیانم
ئیتر ناوەکەت ئەگۆرم
شەرتە پێت بلێم گیانەکەم.

## ڕستەیەکی لەناکاو

خەیاڵی نەکردوی من بوو رستەیەکی وا لەناکاو
هەڵبەست و هۆنرواەکانم بون بە تەلارێکی ڕوخاو
هەرچی وشەی پاکی دڵەکردم بە گوڵی دەستی تۆ
نەتئەزانی خۆشم ئەویٚ بۆ رۆشتی بە جێت هێشتم بۆ
بەڵێنم دا هەتا ئەبەد مەرگ تۆم بیر بباتەوە
سەرم سورماوە لە دڵت داوای نامە ئەکاتەوە
ئاخر چیبکەم هەناسەکەم دڵ رازی نابیٚ بەم حاڵە
دڵم تەنیا تۆ شك ئەبا تۆش لێی دەرچی دڵ بەتاڵە
ئیتر رۆژگارم بیٚ تۆیە شەوم درێژە وەك ساڵە





گەرانەوەم بۆ باوەشت هەروەکو خۆزگەی منالە
چاویشم بۆ ناچێتە خەو بە یادی جارانی ژینم
دەناهەر نەبیٚ لە خەوا ئەهاتم بالآت ببینم.

## سەفەری نا بەدڵ

رەنگە برۆم ئازیزەکەم چاوەرێمە سەفەرکردن
برۆم بەرەو شاری مەینەت هەنگاو بنێم بەرەو مردن
دەبمبورە نازدارەکەم کە سەفەر ئەکەم بەبیٚ تۆ
وردە وردە هەنگاو ئەنێم بۆ گیان کێشانم لەسەرخۆ
ژیانم هۆنراوەیەکە نەهامەتیم پیتەکانی
شەوانم ئیلهامی شیعرە دوری تۆ ئازارەکانی
کە نەتوانم لەم شارەدا پر بە دڵ بالآت ببینم
سەفەر خۆشترە لە دوریت ئیتر بۆ نەشێوی ژینم
گەر رێم نەدەن لەم شارەدا تێر باسی عەشقت بۆ بکەم

دەبا سەرم هەڵبگرم و باڵام بە مەرگ شاد بکەم.

## سەختە ژیان بێ تۆ

کە من تۆم نەبێ شەوانە یادی عەشق لە کێ بکەم
نێرگزی دەستی ژاکاوم دوای تۆ لە پرچی کێ بدەم
گەر سەیرم کەی سەیرە لەلات بەم جۆرە رەنگم شێواوە
کانی بێگەردی پر هیوام ئێستە گۆمێکی لێلاوە
بە دەگمەن بروام پێئەکەن وەلی دێوانە وەك من بێ
دڵم سارێژ بوە لە خەم زەحمەتە خۆشی تێبچێ
نەهامەتی وەك زریزە ئالاوە لە هەموو گیانم
چاوەرێی مەرگی خۆم ئەکەم بێ هیوایە خۆزگەکانم
گیانەکەم خۆزگە ئەمزانی ژیانت چۆن تێئە پەرێ





تەنیا خەمی دڵی تۆمە قەینا لە دڵی من گەرێ
ئاخۆ بڵێی جارێکی تر زەمەن جوان بێ بە تۆم بگات
سەختە رۆژانی بێ تۆیی خوا سەبوری بێ تۆیم بات
خۆزگە جارێ لە پێش مەرگم سەربەی لەماڵە چۆڵەکەم
منیش پر بە دڵم بڵێم دەك بە خێر هاتی گوڵەکەم

ئەوجا بێباك بوم لە مەرگ چونکە ئەمبینی روخسارت
لە مردنیش نە ئەترسام من شاد ئەبوم بە دیدارت
بەلام توخوا ئەگەر مردم مەهێڵە دڵم دەربێنن
چونکە پرە لە یادی تۆ با عەشقەکەی نە شێوێنن.

## دڵ

هەناسەکەم دڵم ئەڵێ
لەجاران زیاتر بە کوڵم
شەوان بە دەم یادی تۆوە
ناهێڵێ بخەوم دڵم
هێجگار عاجزە زۆر زیزە
لە بەر دابڕانی بێ هۆ
یەکجاری ماتو مەلولە
لەتاو کۆچ و سەفەری تۆ
دنیا قسە بۆ دڵم کا





لەگەڵ هیچ کەسێکا نادوێت
تەنیا یەك وشە دەرئەبڕێت
ئەویش ئەڵێ خۆشم ئەوێت.

## دڵم دابو بەتۆ

نەمئەزانی عەشقی دڵت زۆر کەمە و زوو بەسەرەچێ
بڕوام نەبو هیچ ئەڵقەیەك بێ لە ئەڵقەم بۆ تۆ ببێ
بە ڕۆژانەی کرێکاری بە داماوی و بە هەژاری
ئەڵقەیەکم بۆ کری بوی بۆت بنێرم بە یادگاری
کەچی وا پێی ڕازی نابی ئەڵێی وەرە بیبەرەوە
پێمئەڵێی یاری کەم هەیە تۆش بیرێ لە خۆت کەرەوە
باشە من چۆن بێ دڵ بژیم ئەی نازانی چی ڕویداوە
ساڵێکە دڵی پڕ عەشقم بە خوێنەوە بە تۆ داوە
لە پاداشتی ساڵێ عەشقم من لە بیر خۆت ئەبەیتەوە
لەدوای ئەم هەموو جێژوانە بیر لە کێی تر ئەکەیتەوە

بەلاَم گیانە لە دوای کۆچت دلَم بخەرە ژێر چالَیٚ
با ئەوەندە بە خەمەوە لە دوای عەشقی تۆ نەنالَیٚ.

## مامۆستای بیٚ بەزەیی

خۆ هەرتۆ بوی پێت ئەوتم فێری وشەی عەشقت ئەکەم
لەبیرم دیٚ هەموو کاتیٚ ئەتووت لە لێوی تۆ ئەگەم
کاتیٚ کە فێری عەشق بوم وامزانی تۆ مامۆستامی
چارەنوسم دایە دەستت وتم هەتا سەر لەلامی
وەخت بوو من بچمە دنیای سۆزو ئەوین و دلَداری
لە ناوەختا بە جێت هێشتم کردمتە شاری غەمباری
دە مامۆستای بیٚ بەزەیی ئیمتیحان کەی وا کراوە
دەفتەری دلَم سەح بکەی دلَنیام مەعفو کراوە.





## دێم بە میوانی

عەزیزەکەم رەنگە رۆژیٚ میوانێکت بیٚ بۆ لای تۆ
گیانە تۆش بیٚ نازی مەکە دلَی مەرەنجێنە بیٚ هۆ
میوانەکەت هەژارێکە عاشقتە لە رادەبەدەر
رێبواری رێی عەشقی تۆیە کاروانی تۆی گرتۆتەبەر
کۆلَیٚ خەمی لە کۆلَ ناوەوە دەپێی فرێدە و لێی مەسێنە
روخساری تۆ شادی ئەکا توخوا تۆش دلَی مەشکێنە
ئەو میوانەش دیارە منم دێم بۆ سەردانی چاوەکەت
دەهێندەی تر خۆشم ئەوێی ئەی خەمە دلَم ناوەکەت.

## بیرت ئەکەم

بیرت ئەکەم هەناسەکەم وەك جاران هەواڵت نایە
کاتێ کە چاوم هەڵئەبرم وێنەکەت لەبەرچاومایە
خۆ لە دوای تۆ دڵنیا بەلاوێکی یەکجار کەساسم
تۆبێ ئاگای لە حاڵی من کەس پێت ناڵێ دەنگوباسم
بروات بێ رەنگم ببینی سەرا پاگیانم غەمبارە
دڵ بە ئێشە لە دوری تۆ هەناوم پڕ لە ئازارە
چ ئێشێ وەك دووری تۆیە؟ لە تاو خەم بە هیچ راناگەم
بەدوای مەرگا چاو ئەگێرم نازانم بۆ بەدیناکەم.





## بێ بەڵێن

لەبیرت دێ چوینە سەیران بێ باکانە بۆ دەشت وکێو
شادومان بوین دوربویت لە خەم بەرەوە پیرمان هات بزەی لێو
وامئەزانی ئارەزووەکان هانت ئەدام بۆ عەشقی من
بروام نەبو گۆمی رقت بۆم ببێ بە دەریای بێ بن
لە دڵم بۆ تێنەگەیشتی وتم لەگەڵ دڵت پاکم
خۆ کاتێ کە هاتیتەوە هەتا بەردەرگاکەت هاتم
ویستم بنێرمە خوازبێنی دڵت گۆرا وەك تۆ نەبی
راستە من زۆر تاوانبارم چونکە وتم خۆشمئەوی
نەشمدیوە خۆشەویستی هیچ کەسێك تاوانبارە بکات

وشەكانم سەخت نەبوو ئاوا دڵت ئازار بدات
رێگری نابم بۆ دڵت چیت پێخۆشە لە دڵتا بێ
بەڵام گیانە جوابی عەشق نەمبیستوە قەت ئاوابێ !

## بەشی دووەم

## ڕۆژانی زوو





چاوەرێی وەڵامت بوم ئەموت دڵم شادئەكەی
بروام نەبوو لەناكاو فەرمان بەزارت دەركەی
دڵ خۆش بوم وامئەزانی بەرگی شادیم لەبەركەی
سەیرە لە جێی وەڵامت حاشا لەناوم ئەكەی

*     *     *     *     *

بۆم نوسیبوی عەزیزم هە رتەنیا تۆی یارەكەم
وامزانی چراخانی بۆ شەوگارە تارەكەم
پێم ئەڵێی تۆ وازبێنە تۆ لە دڵە غەمبارەكەم

چیبکەم بە دەس خۆم نییە تۆی دەوای ئازارەکەم

* * * * * *

چەندە خۆش بووئەو کاتەی روخساری تۆم ئەبینی
عاشقانمان سەرسام ئەکرد بە خەندە و پێکەنینی
لەگەڵ خۆتا بەرێت کرد یادگاری پر ئەوینی
بێت و سەیری دڵم کەی بەس وێنەکەت ئەبینی.

* * * * *

یەکەم جار بو تۆم ببینی رۆشنایی هاتەچاوم
خۆت وتت دەستت ئەکەم بەشانەی قژی خاوم
لەو رۆژەوە چاوەرێم دانیشتوم جۆش داماوم
هەرچەند وەلأمت تاڵ بێ ناگۆرێم هەروا ماوم

* * * * *





سەر لە کۆچت دەرناکەم بۆ جێت هێشتم یاری جوان
ئەو کاتەی کە رۆیشتی دڵ پر بو لە ئێش و ژان
بەسەر مندا هەڵی کرد خەم و حەسرەت و گریان
گەربێت و دەسخەرۆم کەی نەتیجە جێمە سەیوان.

* * * * *

ئەو کاتەی کە رۆیشتی رەنگە جێژوان گریا بێ
یادگاری عەشقی ئێمە بۆ بە بێناز جێمابێ
چۆن دڵت رێگا ئەدا لە دوای من کەسی تیا بێ
ئەوینمان وا دوای هات هەناسەم ماڵ ئاوابێ

تریفەی مانگە شەوی نێرگزی پێش بەهاری
لەدوای تۆ هاورێی منە شین و گریانو زاری
ناهێڵن ئاسودەبم دابران و غەمباری
ئەی ئەم دڵەم چیلێکەم جێی دێلێ بە یەکجاری

* * * * *

ئەلبومی یادەکانم سەرسام بون بە هەناسەم
گریانیان بۆ حالێ دێ بۆ ئەم دڵە کەساسەم
بۆهەر وێنەیەك ئەدوێم باوەرناکەم لەم باسەم
تۆ ئەرۆی جێم ئەهێڵی ئیتر کێ بێ پێناسەم.

* * * * *

ژیانت هۆنراوەمە ڕۆژانت پیتەکانی
چاوانت سۆمای رێمە دوریت ئازارەکانی
گوڵی دڵداری ئێمە نا حەزێك هات وەرانی
ئاخ لە دەردی دابران بۆ ئەوەندە بە ژانی

ئەو کاتەی کە رۆیشتی گشت هیواکانت بردم





تکای زۆرم لێکردی دەستی عەشقت نەگرتم
کە ویستت بە جێم بێڵی بۆ زوو جوابت نەکردم
بۆت بوم بە لاس و مەجنون هاکا لە دوریت مردم.

* * * *

## بێ وەفابم

ئەو فرمێسکانەی لە چاوت گرم و بێناز دێنە خوارێ
لە چاوانی من تەربون هاتونە لات وەك رێبوارێ

بروات بێ هێندە ئەماوە یەکپارچە رەش بێ هەناوم
دەستەکانم پێراناگەن بیسرن و فرمێسکی چاوم
نازانم بۆ رێگە نادەن من و تۆ ببین بە هاوسەر
دنیایان لێکردینە کۆت لەبەری پێ تا تەوقی سەر
گیانەکەم زۆر باش ئەزانم چیت بەسەر هات لەسەر ناوم
منیش سوێند ئەخۆم بە یەزدان خۆشم ئەوێ هەتا ماوم
ئەگەرچی ناحەز ناهێڵن پر بەدڵم تۆ بدوێنم
لاشەم سەرم بەجێبێڵێ واز لە عەشقی تۆ ناهێنم.

## جێ ژوان

لەوکاتەوە کە رۆیشتی تاجی خەمت لەسەرم ناوم
نەهیچ روخسار بەدی ئەکا نەبێ فرمێسك ئەبێ چاوم





ئەو جێگایەی پیا ئەرۆیشتین سالم و جادەی رزگاری
جێژوانێکی زۆر بێنازە چاوەڕوانە بۆ یادگاری
کە بە تەنیا پێیدا ئەرۆم دڵ ناسرەوێ لەبەر گریان
هەر هەنگاوم مردنێکە بە مجۆرە ئەبینم جێژوان.

## بە شێتی ئەمرم

جاران من بوم کە ئەمتوانی بڵێم لە عاشقی تۆ تێرم
بێباك بوم چونکە ئەمتوانی خاڵی سنگی تۆ بژمێرم

دەستەکانت لە ملما بوو منیش دەستم لە کەمەرت
هەموو رۆژێ ئەهاتمە لات ئاگاداربوم لە خەبەرت
ئەو دەمانەی کە تەنیا بوی بێ شەرمانە ئەهاتمە لات
لە لێوانت تێر نەئەبوم سەرم ئەکردە سەرگۆنات
کەچی ئێستا بە ناچاری وەختە بۆ هەواڵی بمرم
لە خەوە کەشما ناتبینم ئیتر هاوار بۆ کوێ بەرم
لە سوچێکی ژورەوەکەما ناسۆر شادی ئەتۆرێنی
هۆنراوەم وەك هەورێکی رەش بارانی خەم ئەبارێنێ
لە هەر شوێنی بەدیکرێم ئەڵێن کەسێکی خەمبارە
ئەڵێن وەك شاعیرێکی شێت عەشقی کچێکی نادیارە
دەگیانە بەر لەوەی بمرم جارێکی تر وەرەوە لام
ها کا رۆژێ لە پڕ بیستت بە شێتی مردوم بە تەنیام.





# بەشی سێیەم

## نزا و بێبەڵێنی

ئاهی دڵ

سەرەتا خۆشەویستی بو بە دیمئەکرد نەهامەتی
هەموو کات لەبەرچاوم بوبێ بەڵێنی و خەجاڵەتی
چارەنوسم بە تۆوە بێ هیوای دۆزەخ هەڵئەکێشم
یادگاری پر غەدرو درۆ لەناو درکودالْ ئەنێژم
تۆ خیانەت بە خوێنتا بو منیش خوێنم بەس ناوەکەت
دڵی تۆ پر سەدان خۆشی منیش پر لە زوخاوەکەت
دڵنیابە کەمی ماوە ناوت دەرئەچێ بە بەدکار
ها کا رۆژێ ئاهی دڵم رێی پێگرتی وەکو رێبوار
سەربەست مەبە بە جوانییەکەت هەتا ئەبەد بمێنێ بۆت
دوعای دەیان لاوی وەك من دڵنیا بە دێتە ئەستۆت.

## دوعا ئەکەم





پەشیمانم لە وشانەی کە نەفام بوم و دام بە تۆ
زەحمەتە ئەگەر من بلێم راستیت تێدایە بێ درۆ
ئاخۆ هەبێ کەسێکی تر وابێ بەڵێن لەم ژیانە
بروانـاکەم زۆر ستەمە ئەوەی لە تۆم دی تاوانە
وا ئەزانی کە جێم بێڵی ئیتر لەدوای تۆ من ئەگریم
سەرفرازبم شادمانم بێ خەفەت دڵ بێخەم ئەژیم
دوای تۆ شەوم چراخانە رۆژگارم سەیرانو خۆشی
چوار وەرزی ساڵم دوور لەخەم بەبێ ئازارو رەش پۆشی
هەرئەوە ماوە پێت بڵیم روو رەش بی وەکو رەنگی خۆت
ئەڵقەکەت ببێ بە رەشمار دوعا ئەکەم ببێتە ئەستۆت.

## ئەی نازانی

ئەو کەسانە بەد بەخت بن ئارەزومەندی عەشقی تۆن
وێلێ و سەرگەردانی رۆژن ناچارن ئەبێ خەم بخۆن
ئەبێ خەڵك بە وێنەی من بزانێ چەندە رورەشی
خۆ نازانن بێبەڵێنی لە عەشق وراستی بێبەشی
دەك سیمات خەلآت بە گۆربێ هەواڵبێ بڵێن مردووە
شەرمەزاری ئەم دڵەم بی عاشق بێ بەڵێن بووە
دووربی لە ئارەزوو جوانی سەرا پات ون بێ لە میحنەت
هاورێی گری جەهەننەم بێ خوا بێبەشت کا لە جەننەت
وا ئەزانی هەتا ئەبەد ئەو جوانیەت بۆ ئەمێنێ
ئەی نازانی لە دوای مانگێ گۆڕ لاشەکەت دائەرزێنێ.

## نامەکانت دراندم





لە بیابانی غەریبی کەسم شك نەئەبرد گیانە
ووتم دەستم دامێنت بێ تەنیام مەکە لەم ژیانە
کە زانیت بێ دەرەتانم جێت هێشتم وتت خەم بخۆ
زوو بێزاربوی لە عەشقەکەم وتت بۆ چیمە عەشقی تۆ
کۆتایت هێنا بەناوم ئارەزوت بوو دابرانم
سەرت شێوان لە عەشقەکەم نامەکانیشت دراندم
ئەو جا منیش تێر ئاو ئەبم لە دەریای ناسۆری خەمت
بێوەفایت دەرسی پێدام لە ئەفسانەی سۆزی کەمت
دوا بریارم ئەوەندەیە لە ئێستاوە بەڵێن ئەدەم
لێویشم ناوی تۆ بێنێ پەرداخی ژەهری پێئەدەم
گەرهات ورۆژێ لە رۆژان دڵم وتی خۆشم ئەوێ
دڵنیابە بە دڵ دەردێنم بەڵکو دڵم ژێر پێ کەوێ
جوانی ئەوەبێ لەتۆم دی بروا بە هیچ جوانێ ناکەم
ژیانم پر لە ئەوینە روخساری تۆی تێکەڵ ناکەم.

## لێت تێناگەم

چاوەکانتدەری‌ئەخەن
کوێرن لە ئاستی بینینم
نامەکانت هاوار ئەکەن
دوورن لە عەشق و ئەوینم
چیتر تکا لە تۆ ناکەم
وشەی عەشق بدرکێنم
ئەو سۆزەی وا لە دڵمایە
بۆ لەمەودوا ئەی مرێنم
مدەتێکە ژیانی خۆم بە یادی تۆ بەسەر ئەبەم
تا ئێستا جارێك نەبوە
لە ناخی دڵی تۆ بگەم.

## دۆرایت





مەزانە رۆژێ ئاهەنگنت عاشقێکی بەجێماوم
بروا مەکە لە دووری تۆ فرمێسکێ برژێنێ چاوم
لە لات وایە بەشەکراوت ئەڵێی دڵی ئەسوتێنم
دڵنیابە لە پێش تۆدا کارتی ئاهەنگت بۆ دێنم
تۆ قەت مەڵێ بە ئاهەنگم دڵی تەنیای پر خەم ئەکەم
دێم و پیلانەشت ئەکەم لەگەڵ هاوسەرتازەکەم
ئەوجا بزانە دۆراوی کە چویتە ماڵی زاواوە
گیانە تۆ جارێ نابینی لای من کۆن ئەبێ کەژاوە.

## نهێنی

ژیان وەك خەوێك ئەبینم بەم ئاهەنگە کتوپرە

بێ نەوا و بێ هیواتکردم ئا لەم ژورە ساردوسرە
خۆشحاڵی بە جلی زارات سەربەرزی کەشوت کردووە
وا مەزانە کەبێ دەنگم زمانم لاڵە و مردووە
گەر بمەوێ ئاهەنگەکەت لێبکەم بەشین و گریان
تەنیا هەر ئەوەندەم بەسە پۆیلانەتکەم بە نامەکان
یان بمەوێ لە جێی تارا تاجی خەمت لەسەربکەم
وێنەکانی کە لەلامە پێشکەش بە هاوسەرت ئەکەم
ئاسانە لام شەوی پەردەت لێبکەم بە شین و زاری
پێیان بڵێم سەرسنگی تۆ پڕە لە ماچ و یادگاری
بێباکم کە سنگت دەرخەن لای ئەو هاوسەرە شەرمنە
دەیان ماچیبەجێماوم شاهیدن جێ لێوی منە
ئەمانە و دەیانی تریش بەڵگەیە و لەبەردەستمایە
من وەکو تۆ بێوەفانیم وشەی عەشق لە دڵمایە
بەڵام هەر ئەوەندە ئەڵێم تاریك بێ وەکو رووی رەشت
شەرمەزاری ئەم دڵەم بی تا مردن گریان بێ

## دوو ساڵ عەشق

لە بیرم دێ سەرەتا بوو وشەی عەشقم فێرئەکردی





وات لێهاتبوو بە جارێ بۆ دیدارێکم ئەمردی
چی وشەی سۆزو بێگەردە ئەم کردە ناو نامەکەنت
چی نامەیەکم ئەنوسی شادی بو بۆ چاوەکانت
با سەدان کەرەت بڵێم ئاخ بۆ رەنجی بە خەساری خۆم
دەیان کەرەت بەڵێنتدا ئەتوت هاودەمی عەشقی تۆم
بیرتە لەگەڵ یەکەم نامە هۆنراوەیەکم پێبەخشی
لە خۆشیا هێندە گریای خوێناو لە چاوتا ئەنەخشی
کە چی ئێستا کە گۆراوی منیش دڵم پڕ زوخاوە
دڵنیام ئێستە روخسارم لەبەر چاوی تۆ نەماوە
چۆن دڵت هات بێنازیان کەی ئەو نامانە تیابوو گریان
دڵنیابە رۆژێ دادێ نامەکانیش دێنە زمان
هەروشەیەکی نوسیومە لە کاغەز جیا ئەبێتەوە
ئەبن بە مۆرێکی رەش و ئەنوسێن بە روخسارتەوە
ئەوجا گشت کاتی تەمەنت پڕ ئەندێشە و ئازارە
ئاهی من دوو ساڵ عەشق بەناو چاوانتەوە دیارە.

## دوانامە

سەیرە لەلام ئەو رۆژانەی پڕ فرمێسك بو چاوانم

چۆن دڵی خۆت ئۆقرە ئەگرێ دابرێی لەنامەکانم
خۆ من هەرچیەك بنوسم یادی جارانی پێوەیە
سەرەتای هۆنراوەکانم هەموو بەناو تۆوەیە
دەیان جار سوێندم بۆ خواردی وتم بەڵێنت پێدەدەم
دە من چیبکەم کە ناهێڵیت بە هیچ جۆرێ بە تۆ بگەم
تەمەنێکە بۆ تۆ ئەدوێم بێوەلامە وشەکانم
هیوایەکت پێ نەبەخشیم ئاسودە بێ خۆزگەکانم
تۆ هەر بۆ خۆت فێرم ئەکەی عەشقت لابەم لەم گەردنە
بەڵێن بێ ئەم هۆنراوەیەش دوا نوسینی نامەی منە.

## ئازار بنۆشە





ئیتر نابم بە حەکیمێ بۆ ئازاری زامەکانت
چاوی خۆشم ئازار نادەم بە خوێندنەوەی نامەکانت
لە بیری خۆم ئەبەمەوە جێژوان و عەشق و یادەکان
هێندە زەبون بوم بۆ ناوت لە خۆمم وێران کرد ژیان
هەرگیز خەم ناخۆم بۆ کەسی عەشق تێکەڵ خوێنی نەبێ
بەس کاتێ لە خەیاڵی بم کە بە لامدا تێپەر ئەبێ
لە بیرم دێ دووری و عەشقت لەناو پەرەی دڵما ئەبوارد
خۆ تۆ بیرت لای خەم نەبو بەشەکەی تۆشم خەم ئەخوارد
ئەوا ئیتر توانام نەما دڵم لە تلە تەو بریندار
خەمی بۆ لە خۆ ناگیرێ خەمەکانی لێدێنە خوار
ئازارەکان دائەماڵم ئیتر دڵم سەربەخۆیە
دەتۆش با ئازار بنۆشی بە حەقیش بێ سەرەی تۆیە.

## تۆم بیرئەچێ

ئەو رۆژانەی پێکەوەبووین هەموی رۆی سەفەری کرد
دڵنیام ناییینینەوە زەمەن بۆ دڵێکی کەی برد
ئاخۆ ئەوەی لەگەڵتایەوە وەکو من دڵت بداتێ
یا سۆزی دڵی بێ خەمی وەك سۆزی دڵم بتگاتێ
بەلاّم هێندە ناخایەنێ دڵ ئەگۆرێ تۆی بیرئەچێ
دڵنیابە دوای ئاهەنگت بە بینینت زویر ئەبێ
ئەو کاتانەی کە ئەتبینێ وا هەست ئەکا کە دوژمنی
خۆ سۆزی بە تۆنا بەخشێ کز دانیشە بە شەرمنی
کاتێ بە ئاگا دێیتەوەتەمەنەکەت لە دەست ئەچێ
منیش بە دڵ بۆت ئەسوتاوم بۆ لەمەولا تۆم بیرئەچێ.

## لە دوای تۆ

سەیری جەستەی من چەنێ ژاکاوە





چاوی بێنازم گۆمی لێلاّوە
ئیتر چۆن بژیم من بە تەنیایی
بۆ بەجێت هێشتم بێ ماڵئاوایی
هەناسەکەم تۆ بۆ تەنیات کردم
دووری و نادیاریت ئاواتی بردم
دۆزەخ بۆم هاتە ناو ئەم ژیانە
لە دوای تۆ بوم بەوەلی دێوانە
ژیانم ژانە دوور لە بالاّی تۆ
بە جێم مەهێڵە و ئەم جارە مەرۆ
چۆن دڵت دێنێ بۆ سەفەر ئەچی
لە کاتێکا من کە هەر تۆم هەبی.

# بەشی چوارەم

## بمبورە

لێمگەرێ





کچی شۆخ چاوەرێم مەکە بۆ تیشکی بێ روناکی دڵ
ئاوات و حەزم مەلێك بوو دای لەشەقەی باڵ لەسەر چڵ
لە جێی وەنەوزی کاتێ خەو هەنسك و گریانە شەوم
لەبری شەوچەرەی شەوانەم خەم نەخۆم هەرگیز نا خەوم
ئەوەی لە من بەدیئەکەی تەنیا رەنگێکی خەیاڵە
تێکەڵ بونت لەگەڵ دڵم گەلێ زەحمەتە زۆر تاڵە
خۆت مەهاوە ناو ئاگری کورەی گەرمی ئەم ناخەوە
لێم گەرێ با هەتا ئەبەد هەر تەنیابم بەم داخەوە.

## خەم بێسنوور

گیانە  نەکەی عاشقی من بی ژیانی من دەردو ژانە
لە جێگەی خەندە و پێکەنین خەمە فرمێسکی چاوانە
بۆ خۆت ئەکەیتە دۆزەخی دڵی کەساسی بێکەسم
کوا من شایەنی ئەو عەشقەم تکایە دەست مەخەرە دەستم
بروا ناکەم تیشکی هیوا روو لە دڵی تەنگم بکات
بۆ دەریای پڕ لە ئەندێشەم لاشەی تۆش لەگەڵ خۆی ببات
دڵی پاك و بێگەردی خۆت تێکەڵ مەکە لەگەڵ خەما
دڵنیابە رۆژگاری من تروسکەی شادی تیا نەما
دەبمبەخشە عەزیزەکەم یەکجار دڵمان لەیەك دوورە
تۆ سەرەتای خۆزگەکانتە منیش خەمم بێسنوورە.





## ناگەم بە تۆ

لە دورەوە بە من ئەڵێی چەند جوانە هۆنراوەکانت
ئەڵێی خۆزگەم بەو کەسە بیّ وەك هاوسەر دێتە ژیانت
تامەزۆری ئەو کەسانەشی هەموو دەمیّ چاویان لێمە
خۆزگە بەوانە ئەخوازی کە لەگەڵما وەك هاورێمە
گوڵم بەهەڵەدا مەچۆ وەك دۆزەخ وایە ژیانم
گەلیّ زەحمەتە بۆ جوانیت بیبیتە دەریای خەمەکانم
ساتەوەختەکانی ژینم هەمووی ئەندێشە و ئازارە
بێت و شادی ریّ بزرکا بێتە لای من شەرمەزارە
تاونێکی نارەوایە ئەو سۆزەی وا لە دڵتایە
تۆ دڵی منت بۆچیە ناسۆرەکەی داویی نایە
ئیتر دەرمکە لە دڵت تکایە پێم مەڵیّ مەرۆ
چونکە گیانە دڵنیابە هەتا ئەبەد ناگەم بە تۆ.

## چاوەڕێم مەبە

ئەو نامەی کە بۆت ناردوم هەستێکی جوانی تێدایە
وشەی وات تێدا نوسیوە عاشقم بی تاهەتایە
ئازیزەکەم خۆم پێت ئەڵێم ئەوینی خۆت مەشێوێنە
خەندە و بزەی سەرلێوانت بە عەشقی من مەتۆرێنە
بە چاوانم مەخەڵەتێ کاتێ نیگای تۆی پێئەکەم
ژیانم گەلێ شێواوە با ژیانی تۆش تێکنەدەم
شەو تا بەیان روو لە ئاسۆم ئاخۆ کەی شادی بێتەوە
لە چرکەیەك تێنا پەرێ پێکەنینم ئەبرێتەوە
کەوابێ منت بۆ چییە دڵم بۆتە دەریای بێبن
رەنگە بێیتە ژیانمەوە پەشیمان بی لە عەشقی من.





## عەشق رێنادات

گوڵم سۆزی من وەلانێ ژیانی من بێ خەندەیە
ئەوینم تیا بەدیناکەی خۆشیەکانم خەم بردەیە
رۆژگارم تاریکستانە دێوانە ئاسام و خەمبار
مۆمی تەمەن توایەوە بە لاشەی خۆیدا هاتەخوار
هاوین لای من بەستەڵەکە بەهاریشم وەکو خەزان
خەندە بیەوێ بێتەلام رێی پێنادەن شین و گریان
گەر سەردانی ژورەکەم کەی لە باتی گوڵێ رازاوە
هۆنراوەی خەمبار ئەبینی لەسەر دیوارە و نوسراوە
هەناسە ناگەم بە تۆ داوا ئەکەم لێم ببورە
دڵی پاکی پر ئاواتت لە دڵی پر خەمم دوورە
ئاخر کەی عەشق رێ ئەدا من و تۆ ببین بە هاوسەر
من لاشەم لە خەما ون بێت تۆش بێگەرد لە رادەبەردەر.

## خۆشم ئەویٚ

ئەی کچی شۆخ بەسە تاکەی ئاشکرا ناکەی نهێنی
ئەوەی لە دڵتایە بیڵی ئیتر تاکەی نایدرکێنی
چاوەڕێی نیگای تۆ ئەکەم وەختە ڕەشببیٚ هەناوم
خۆ لە جوانیەکەت کەم ناکا تەنیا جارێك بڵێی ناوم
بروا بکە لەناو دڵما چراخانی نیوەی شەوی
چونکە لە جێی جاریٚ دەجار دڵنیابە خۆشم ئەویٚ.





## تۆی پێناسەم

ئەگەر بڵێم خۆشم ئەویٚ بۆ دەرنابریٚ ئەوینی
چۆن بڵێم تۆ چاوەکەمی دەهێندە چاوم شیرینی
یا تەنیا بڵێم گیانەکەم تەنها و تەنها هەرگیانم بیت
ئەی تۆ زەردەخەنەی لێو شادی و خۆشی ژیانم نیت
بە تەنیا ناتکەمە دڵم بۆئەوەی دڵ بجوڵێنی
حەزئەکەم لەناو خوێنما بی با گشت جەستەم بهاژێنی
هەرچی بڵێم بۆ عەشقی تۆ ئێستەش دەهێندە ئەمێنیٚ
عەشقی تۆ بورکانی گرە لە دڵما کڵپە ئەسێنیٚ
بروات هەبیٚ وا هەست ئەکەم بە تەنیا تۆی پێناسەکەم
بۆیە پر بە دڵم ئەڵێم خۆشم ئەوێی هەناسەکەم.

## وێنە

کەسەیری وێنەکەم ئەکەی چاوەکانم بخوێنەوە
بۆیە چاوم سەریەك نەنا لەگەڵ لێوت بدوێمەوە
ببینە سیمای ژاکاوم هەروەکو من نەبم وایە
جاران دەمم بە پێکەنین ئێستە گریان لە چاومایە
سەرا پا جەستەی زەبونم دوای دابرانت ژاکاوە
تەنیا دڵ سەبوریم ئەدا چونکە ناوی تۆی تیا ماوە.





## بە تەنیا یارم

سەدان زەردەخەنە و خۆشی
زامی دڵ پرناکاتەوە
ناسینی دەیان کەسی تر
خەمم لە بیرناباتەوە
پێکەنین و خەندە و خۆشی
بێمانایە بۆ لەدوای یارم
خۆشەویستی هەموو دنیا
رۆشن ناکا شەوی تارم
بروا ناکەم هەتا مردن
شادی لە دەرگای دڵ بدات
ئەو کەسەی کە بەجێی هێشتم
تەنیا ئەو لە من تێ ئەگ.

## پرسیارت لێکردم

پرسیاری ماڵت لێکردم وتت ماڵەکەت لە کوێیە
دڵم نەهات بیدرکێنم دڵم لەت لەتی سەررێیە
واتزانی باوەرم نییە بە دڵی پر لە ئەوینت
نەخێر گیانە تۆ هەڵەبوی پیرۆز بو عەشقی شیرینیت
مەبەستم بو پێی نەزانی کەئێشی دڵم گرانە
وتم با هەرخۆم خەم بخۆم ژینم دەردەسەری و ژانە
وام ئەزانی تۆخەم ئەخۆی بۆ دڵی پر لە ناسۆرم
وتم بەزەیت پێما بێ بۆئەندێشەی زامی زۆرم
کەچی لە جێی هەست و سۆزت بریار ئەدەی بەجێم بێڵی
ناو وشە و یادەکانم هیچی لە دڵتا نەهێڵی
دڵنیابە مەرج نییە لەسەرەتادا چۆن ئەژیت
جوانترین کەس ئەو کەسەیە لەناو خەما خۆشی ئەوێت





## دورم لێت

ئەزانم گیانە لە دوریم لێوی بە خەندەت بێنازە
چرکەکانی تەمەنی تۆ وەك شعرێکی بێنازە
فرمێسکی گەرمی جارانت راستی بەڵێنت دەرئەخەن
هەنسك و گریانی دڵت وەختە لەگەڵ یەك شەرئەکەن
ئەگەرچی رێگەشم دوورە گەلێ دورم لە چاوانت
هەتا مردن چاوەرێتم وەك هاوسەر بێمەژیانت.

## تۆی ڤینۆسی چاوەكانم

كە من نەگەم بە دیدارت ژیان بیٚ مانا ئەبینم
ئەگەركاتیٚ لەبیرم چی حاشا لە تەمەن و ژینم
ئەی ئەو كەسەی هەتا مردن تۆ دوا چركەی هەناسەمی
تۆی ڤینۆسی چاوەكانم بۆغەریبی پێناسەمی
وشەی سەرنوكی قەڵەمی تۆ نەبی هەستم شێواوە
بەبیٚ تۆ شیعر بنوسم هۆنراوەكەش ناتەواوە.





## دابران چەندە بەسۆیە

سالأنێكە چاوەروانم بۆ چركەیەك خەندەو خۆشی
لە جێی خەندە بیٚ نەوایی بە جاریٚ بالأمی پۆشی
ئەو خەمەی لە چاوەكانم بەدی ئەكەن وەك رۆژیٚ روون
خەمی لەیەك دابران و لێك جودای و بۆیەك نەبون
ئازارنییە وەكو مەرگ زۆر زەحەمەتەبۆ گۆر بردن
بەلأم ئازاری دابران زۆری نامێنیٚ بۆ مردن
رەنگە كەسانێكیش هەبن باوەرنەكەن بەم وشانە
نەكەن هیچ لۆمەیان بكەن دون لەخەمی شەوانە
چونكە كەسیٚ عاشق نەبیٚ ئازاری لە لا درۆیە
بە تەنیا عاشق ئەزانیٚ دابران چەندە بەسۆیە.

## دیاریەكانت

گەر پەنجەم چاوی هەبوایە ئەو جا وەسفی تۆم پێئەكرا
مەگەر زمان لە دڵ بڕوێ جاناوت لە دڵ دەرئەكرا
بە دوو لێوی منا نایە كەبڵیم تۆ لە بیر ئەكەم
دابرانم لە چاوی تۆ تەنیا كۆچە ئەگەر بیكەم
من ئەزانم بێ تۆ بژیم یادەكانت ئەم سوتێنێ
هەر هەنگاوێكم هەورێكە بارانی خەم ئەبارێنێ
ئەو دیاریانەی بۆت ناردم پێشكەشت كردم بەیەك دێر
یەكیان ئەڵقەیەكی زیوە ئەوی تر زنجیرێكی زێر
ئەڵقەكەت هەروا لەلامە هەموو جارێ ئەكەم یادی
بەڵكو خۆت لە پەنجەمی كەی لەرۆژی ئاهەنگ و شادی
زنجیرەكەت بە حەرفەوە لە ملمایە تا مردنم
مەگەر بە مردویی بشۆن ئەو جا داینێن لە گەردنم.





## فرمێسك

كاتێ هۆنراوە ئەبینی ئەگەر زانیت زۆر خەمبارە
بروابكە هەڵقوڵاوی ناخی دڵمە بە ئازارە
مە پرسە بۆ نوسەرەكەی پرسیار مەكە لێرەو لەوێ
دڵنیابە هی كەسێكە چەندین ساڵە تۆی خۆشدەوێت
بمبورە ئەگەر پەرەكەی زۆر كاڵبۆتەوە بە جارێ
تاوانی فرمێسكەكانمە خۆی رانەگرت كەوتە خوارێ.!!

## ئاسیا

دەك ئاسیا تۆ ئاوەدان بیت كە دەنگی وام بۆ ئەهێنیٚ
پرچی دڵدارانی بیٚ ناز بە شە پۆلت دائەهێنی
چ ئامێرێك پێشكەوتوە خودایە هەموویت هەبێت
دە یارەبی بورجی ئیڤل بچوكترین بورجی تۆ بێت
لە ئاسیاوە بە من گەیی‌دەنگ و پێكەنین و ناوت
هەر ئاسیابو شادی كردم بەرەنگ و بەبالاٚو چاوت
لەم شیعرەدا ئەڵێم ئاسیا شە پۆلەكەی عەشقی تیایە
رۆژی دوو كارت داخلٚ بكەم هەر ئەڵێم دیاری ئاسیایە.





## خەمێكی گران

هەناسەكەم مۆمی عەشق توایەوە بەسەر ئەچیٚ
ئەجەلە نەهامەتیە عەشقەكەمان لە دەست ئەچیٚ
قوڵپی گریان لە دڵمایە نازانم كەی بۆت برێژم
یا تەرمی عەشقی بیٚ وهیوام لە چ گۆرستان بنێژم
چەندە سەیرە ئەم روداوە ئازارێكە گەورەو گران
من چۆن بێمە ئاهەنگەكەت دوایش بۆ پرسەی دابران.

## نامەو شیعر

ئەڵێن کە دوێنێ ئێوارە کاکت نامەکەی گرتووە
چاوی سور لێتهەڵگەڕاوە بەتوندی قژتی گرتووە
وتویەتی ئەم هەتیوە ئەبێت تۆ پێم بڵێی کێیە
بێ ئەدەبی شارەکانە یاخود نەزانی لادێیە
بە لێدان زۆری لێکردوی بۆ ئەوەی بزانێت من کێم
هەواڵی منی پرسیوە ئەبێت لە کوێ بێت شوێن و ڕێم
کاتێك نوسینەکەی دیوە خێرا پێیوتوی بمبورە
نوسەری ئەم هۆنراوەیە شوێنی نزیکە یان دورە
بە هەرجۆرێك بێت پێبڵێ لە سبەینێوە تا شەوێ
تکا ئەکەم لێمببورە هۆنراوەیەکم لێی ئەوێ





چونکە منیش وەکو ئێوە دڵم سوتا بە دڵداری
لەداخی بێ هیوای خۆم لە تۆ ئەدەم بە ناچاری
ئەو هۆنراوەیەی کە من دیم تەواو دڵی داخورپانم
تۆ چەندە ئەوت خۆش دەوێت دەهێندە چاوی گریانم.

تکایە هەرکەس ڕەخنەو پیشنیاری هەبوو یان هەر هونەرمەندێك ویستی ئەم شعرانە بکات بە گۆرانی لە ڕێگای ئەم ژمارە مۆبایلانەوە پەیوەندی بکات بە شاعیرەوە.

ژ.مۆبایلی ئاسیا : 07701451416
ژ.مۆبایلی سانا : 07301111273

سوپاس و پێزانینی زۆرم بۆ ئەم بەرێزانە:

- هونەرمەندی لاو بەختیار ساڵح
- شاعیری لاو شەهاب زەنگەنە
- وەلید گەرمیانی
- توانا رەسوڵ
- وەسوپاسی هەموو ئەو کەسانە ئەکەم کە بەردەوام هاندەرم بون بۆ بەرهەمی نوێ.

